# دیوان سۆران

حەسەن سەلاح سۆران

لەسەرئەرکی ئەمیر کیا (ع. تیکانتەپە)

## بەناوی خودا

## ☼«( سەرەتا )»☼

زور خوم بە بەختیار ئەزانم کە یەزدان ئەم هەلەی بە من داوە کە توانیم بە ناوی ناسینەری (معرفی) گەورەترین هونەری ها و چەرخی کورد یانی سوران ئەم چەند دیرە لەم دیوانە دا بنوسم .

من بەنوبەی خوم خویندنەوەو لی کولینەوەی ئەم هەلبەستە ریکو پیکانە بە تەواوی کوردزمانە خوشەویستەکان تەوسیە ئەکەم وە هیوا دارم کە خویندەوارە ئازیزەکان لە ریز گرتنی ئەم جورە کەسانە دا کە ژیانی خویان بو خزمەت بەویژە و زمان و فەرهەنگی نەتەوەکان تەرخان ئەکەن بەلە ونیکی شیاو هەنگاو هەلگرن ، چونکای تەنیا تەشویق( دل خوش کردن )و دل گەرم کردن و قەدر زانینە کە ئەتوانی دلی هونەر و هونەرمەندان زیاتر بە کول بینی و بیجگە

له مه كه ئه مه بوخوى قه‌ره بو ( پاداش ) كردنه وه يه كه بو نوسه‌ران و هونه‌ر و هونه رمه ندان له لايه يكى تريشه وه هه سيتان دينيته سه‌ر ئه‌مه كه شوينه وارى‌هونه‌رى دلگر ترخه لق و دروست بكه‌ن.و به‌دى بينن .

خوينده وارى خوشه ويست ! ئاياعه يب و شوره‌يى نيه بـو ئيمه تا ئه ورا ده‌يه ته پلوس و بى خه به ر بين كه هونه‌ران و نوسه‌رانى خومان نه ناسين وه‌لييان بى هه‌وال بين هه‌ر له به‌ر ئه‌مه من‌به‌پيدا ويستم زانى له سه‌ر خوم كه هونه‌رى ئه‌م هه‌لبه‌ستانه به ئيوه‌ى ئازيزبنا سينم . چونكاى مه به ستى هه‌مو بو خزمه‌ت به ئيرانى ئازيزه وبه گه لى وه‌لات.

ئيمه‌ش ئه گه‌ر وه كو نه ته وه كانى ترهه ستى ئه ده‌ب په‌روه‌ريمان ببى زور جيى بروايه كه له ويژه اونانى گه‌وره وكو ( شه‌يكسپيرى ئينگليزى ) وه يا ( لا مارتينى ) فه رانسه وى مان تيدا هه لكه وى . هه‌ر وه كو له مه وپيش

که زور مان لی هه لکه وتوه به لام ـ له لای گه وهەریه قیمەتی گه وهەر .

# سۆران کییه

سوران ناوی حه سەن وه شوره تی سه لاحه و ناز ناوی ( تخلص ) شیعری سورانه و کوری زانای مەزنی کورد خوالی خوشبو برایمی سه لاحه وله هوزی بەگزادەی موکریه ئەم هونه ره پایه به رزه له سالی ١٣٢٠ کوچی هه تاوی داله دیی سارو قامیشی فەیزوللە بەگی له ناوچەی بوکان ـ وەلاتی ئیراندا هاتوه تەدنیاوه . وه ئیستەش هــەر لەم دییه یه .وه له تەمەنی یازده ساليه وه هونراوەی کوردی نویسوه .

## «( پلەی سوران له زانستدا )»

١ ـ سورا نوسه واد ـ سوران هەروه کو زورتری هونەره کانی جیهان به هوی نبوغی خویه وه فیری سه واده دو

ژانست بوه . ئەم هونەرە هیچ کاتی لە هیچ قوتا بخانە یە
کدا دەرسی نە خویندوە . بەلام بە هوی رینوینی باوکیە
وە وکە لك وە رگرتن لە کتیبخانە خانە وادە ییە کەی
خویانە وە زە وقی خویندنی کە و توتە سەر وەبەلە ونیکی
سەر سور هینەر بە سەر زمانی ئنگلیزی و کوردی وروسی
و فار سیوفە رانسە دا چاك زال و سەر کە و توبوە چ لە
خویند نە وە و چ لە نویسنو قسەپی کردنیان دا . وەچەند
زمانی تریش بە جوری سەرە تا یی ئە زانی .

٢ ـ سورانو وینە گەری ـ سوران هەر لە مندالیە وە
دیمە نە دل رفینە کانی وە لاتە کەی سەرنجی ئەویان را
کیشاوە بو لای وینە گە ری ( نقاشی ) وە دەستی کردوە بە
وینە گەری دیمەنی سورشت ( طبیعت ) . وە بوخوی
هیوا دارە لەم بە شە شدا سەرکە و تنیکی مەزن بە دەست
بینی و بتوانی شانوی وینە گەری شە نگوشول برازینیەوە

٣ ـ سورانو مـوسیقا ـ ئەم هونەرە موسیقاشی زورپی خوشە وە بوخوی ماوە یەکی دریژەکە لەگەل نوتو موسیقی کوردی داخە ریکە وکە مانیش ( ویلن ) لی ئەدا دە نگی عودیشی زور پی خوشە .

٤ ـ نوسراوە کانی سوران ـ سوران تائیستا چە ند کتیبی بە زمانانی جور بە جور نوسیوە کە بریکیان لە چاپ دراون بە لام بریکیان ماوە لە چاپ بدری . هیندی لەم نو سراوانە ئە مانەن :

الف ـ فەرهەنگی کوردی ـ ئینگیزی لە شەش جە لدا.

ب ـ بە سە رهاتی زانای روژ هەلات برایمی سەلاح .

ج ـ چاودیری میژویی وفە رهەنگی لەسەر ژیانی تایە فەی فە یزوللە بە گی کە بە یارمەتی دوکتور ( ولف گانك رود ولف ) ماموە ستای زانستگەی بیرلینی روژا وایی نویسویە تی .

د ـ فەرهەنگی کوردی ـ فارسی لە سەد لاپەرەدا .

ه ـ شەجەرەی ئەنسابی بەگزادەکان ، لە روپەرێکی زور گەورەدا .

و ـ فەرهەنگی فارسی ـ کوردی لەدوسەد لاپەرەدا .

ز ـ فەلسەفەی سوران .

ح ـ ئەم کیتبە هەلبەستەش کە پێشکەشتان ئەکری .

٥ ـ سورانو دەستکرد ـ سوران لە کارەبا ( ئەلەکتریستە ) داسەری باش دەر ئەچێ و بەلەوینکی ئاماتوری رادیوسازی ئەکا .

## خوو خدەی سوران

ئەم هونەرە لەگەل دیمەنی سورشت دا خوشەویستیەکی قولو بەتینی هەیە بەتایبەت لەگەل بەرجەوەندی دلڵاوینی پایزدا خاوەنی رازونیازیکی گەرمو گورە .

سوران نوسینی بەقەلەمپاندان ( خود نویس ) پێ خوش نیە.

بۆنی عەتریشی پێ خۆش نیە . زۆر حەز لە ژیانێکی سادە ئەکا .

سۆران لە تاقمی زەحمەتکێشە ودژی بێکارەوتەمەڵە. هەر کەس هەنگاوێك بۆ رەفیقیو برایەتی بۆلای ئەو بێیتە پێشەوە ئەودە هەنگاو بەڵکە زیاتر نزیکی ئەبێتەوە .

## لەونی هەڵبەستەکانی سۆران

سۆران لە نوێسنی هەڵبەستەکانیدا هیچ کاتێ مانای بە قوربانی قافیە نەکردوە بەڵام هەر لەم کاتەشدا بەلەونێکی باش هۆنراوەکانی لە سەر وەزنێکی رێکو پێك نوسیوە وە لە هەشت نۆ دە وەزندا هەڵبەستی هەیە .

لەلایەکی تریشەوە هۆنراوەکانی هەموی بەدی هێنراوی خەیاڵ وقەڵەمی خۆیەتی وبە هیچ چەشنێ لاسایی (اقتباس) خەڵکی نەکردوەتەوە .

ئەم هونەرە لەزۆرکەوشەنداهە ڵبەستی هەیە : هی کۆمە

لایەتی ، غەرامی ، فەلسەفی ، عیرفانی وتەسەووفی کە
هەرکارمیکیان لەجیی خویدا شاهکاریکی ویژەیی کوردیە

## «( دیمەنی سوران )»

سوران کە وینەکەشی لە روپەری ژومارە داهەیە
پیاویکی کۆلەگەت و سورکارە ، چاو کال ، موزەردەکە
نیوقەدیکی باریکی هەیە و زور ترلیباسی بەینە لمیلەلی
( کوت و شەلوار ) لەبەر ئەکا .

**بە پینوسی ع. تیکانتەپە (ئەمیرکیا)**
۱۳۴۵ / ۸ / ۲۱
آدرس : ایران - آذربایجان غربی - بوکان

## « دیمەنی بەهار »

خاکە لیوە رویور ابورد مانگی گول پەیدا بوە
بە ندە نوشیو و ترویان وەك تار اخار ابوە
کوترد باریکە لە سەر چل بویە واشە یدا بوە
چونکـە زستانی شرو دربی لفوتە نیا بوە
ئیستەکانی چاوە بر کیو وە ختی دەستە ملاینە
پرشەی روناکی تروسکە پەچەی هەوری دادری
پرتە وزمی زرقوبرقە وەك بلیسەی ئاگری
هەوری تالورەش بە گورمەی پیکەنینەوداخوری
حوکمی شولاوەی بە بارشت بەسەرمە لبەندابری
بە هارکاتی پیکەنینو بەستە و گور انیە
چورچورەو چوموچوماو وچومەلان چوراوە بون
پرفرمیسکی پیکە نین بویە وا پەنگاوە بون
لولو گرژو گیژو کرژن وە کوقژ راز اوە بون
وەك فریشتەی بەختی بو کن ـ هاوەسەرینی زاوا بون
سورەشت گەرمی گە شتو گیلە وسیکە نەوسەر خانیە

فەلاو شوانو جوتیاران پڕ بە دڵ شادی ئەکەن
سەیری ئەیپامی بەهارو ڕوژی ئاز ادیئەکەن
بەدرەقەیدە ورەی سەهۆلو نەخسو بیدادیئەکەن
بەزمی گورانیسوروشتوچەرخیشەددادیئەکەن
خالە سورانیش لە وییە وەدرپلە زیقاینە

(١) خاکە لیوە ـ هەوەڵ مانگی بەهار .(٢) تروسکە ـ چەخماخە

# «تاسەی چاوکەژاڵ»

چاوکـە ژاڵلیوئاڵ بـە ژنـو باڵا بـە رز
تالانگە ری دڵ نە و نە مام لەش تـە رز
خشڵی ژیانم شیرین لەنجە و لار
ئیلهامی ئیستام بیگانەکەی پـار
من کە دڵم دا بە کە زیەی کرژت
بەپە لکە و پرچی پە خشا نوپرژت
بە بزە و قاقا وجەفەنگی مە نگت
بە فرمیسکی گەشوەك دەریای پە نگت

بەسوزەی خوشی وەك زرەی چەنگت

بە گروزیکی زایە لەی دەنگت

بە خالی شینی پیروزە رەنگت

بە شیوەی ریکو پیکە و تووشەنگت

بە برژولی تیژوینەی خەدەنگت

بە بروی پەیوەست کەواینو چەنگت

بە دلی نەرموخە یالیو تەنگت

بە لاتیلی(١) گورج وەك چزی هەنگت

لە بیرم مەکە گو لباغی گولزار

بو کی شاخو کیو کارمامزی(٢) شار

وەك سوران تاسەی ماچوقەلە مەتم

بە پولەی وینەی هاوشەوقی شەمتم

(١) لاتیل ـ گریشمە . (٢) کارمامز ـ بە چکە ئاسك

# «بیرەواری»

ئەم پەیکە رەکەوینەی لەشو هودەی دلو گیانی منە
بیرە واری بی لەلات چون دیمەنی سەردەمی لە ژیانی منە
دلی سوران لەسوری تورا ئەچەنیو هەل ئەتە کیو قور ئەپیوی
هەر ئەمەش هوی دللگەرمیو سەرکەوتنومایی زیندومانی منە

(١) بیرە واری ـ یادگار

## ☆« وه‌ره‌ ساقی »☆

وه‌ره‌ ساقی به‌ كول بینه‌ دلی كه‌ یلم به‌ هوی باده‌

به‌ جامی مه‌ی خه‌ لاتم كه‌ و سه‌ ری تو نگه‌ مله‌ بو باده‌

شه‌ ر ابی ئالی یا قوتی بده‌ ه ده‌ ستم فه‌ له‌ ك باده‌ (١)

ته‌ پو تو زی خه‌ یا لا تو خه‌ فه‌ تبا ریم وه‌ به‌ ر باده‌

به‌ قیبه‌ی ژینی كه‌م ماوم ده‌با دیوا نه‌ ومه‌ست بم

به‌ لام موتر یب ده‌ خیلت بم نه‌ وای سه‌ متور وتارم بی

(٢)

زره‌ی چه‌ نگت وه‌ كوسوزه‌ی نیگاری كه‌ زیه‌ تارم بی

(٣)

تكه‌ ی عودی سه‌فا به‌خشت مه‌ زه‌ی ئه‌ فكاری تارم بی

فسونی ده‌ نگی شه‌شالت خورا كی پو دو تارم بی

سه‌ راسه‌ر عومری ئه‌ فسا نه‌م ده‌با شه‌ یدا و پرهه‌ست بم

له‌ ویش مه‌ عشوقی ته‌ نناز ووه‌ فا دارو له‌ باری من

(٤)

دلم گه‌ ش كابه‌ خو ینگه‌ رمیو بلا و ینی له‌ باری من

فه‌ له‌ ك به‌ لكو بداماوم به‌ دی بی كارو باری من

هه تا دوازه ربی دل سوران که ئه روا کوچو باری من
ئه بی هه ر تالبی باده‌ی علو مو نه سه روهه لبه‌ست بم

---

( ١ ) باده = بایه . ( ٢ ) تار = ره‌ش ( ٣ ) تار = ویل .
( ٤ ) له باری من = وه کو من .

## ☆« شه‌نگی خیله گوله که‌م »☆

گوله که‌م لـه به‌ ردله چاوی وه‌ك شه هینی هه یه
هاتو چوی کار مامز یو له نجه‌ی دلشیوینی هه‌یه (١)
گه ردن کیله گولی‌عیله شه نگی‌خیله گوله که م
وه‌ك مه ر بیره بیره یه و کو یستانو گه رمینی هه یه
په رچه‌م خاوو ئالو زاو که زیه شیو اوه سه نه هه‌م
پرچی ریحا نه ی ره شه داوی دلـرفینی هـه یـه
بر ژو لی په ر تاوسین بروی کو لکه زیر ینه یه
هه نیه ی ما نگه شه ویه و کو لمی پلی خوینی هه یه
پو کی چینی چین د د انی سولی سه ده فین (٢)

راویژی چەورو شیرین و تەی خەم رە وینی هە یە

لیوی ئالو قە یتانیو خال لە سە رە غو نچە دە مە

بە لگی پە ری پە ر تو کە ــ چەن هیو او بەلینی هەیە

مە مکی هیلکە بار و کە ن کر چنو کا لوتورتوتو ل

لە گو لخانەی سە ر سنگی هیلا نە ی بژوینی هە یە

قامکی چوزە ریو اسن نە رمور یکو لو سو شوشن

کاری عاشق کوژیە وزە ر گی دلدە رهینی هە یە

شە نگوشو خو نە و نە ما موقە د بار یکو شلو مل

بالای تە رزو پیکە وتوی وەك پە لکی لا وینی هە یە (٣)

سور انیە لیم حالیە جە ر گم لە تـە بـو ی

سورا نمو هە لبە ستم زمانی بـد وینی هە یە

( ١ ) كار مامز = بە چکە ئاسك . ( ٢ ) سول = سپی و سو ل

( ٣ ) لاوین = چومی لاوین

## «شەماڵی وادە» (١)

هانگی ڕەشەمۆ پاشماوەی زستان
خاڵو واڵ دادێ لە چیاو لە کویستان
شەوێک لە کاتی ماڵ نوستناندا
شنەی بای شەماڵ لە دارستاندا
چیا لای ئەنوێنێت بەشادی و دەماغ
دڵی پیر بۆی ساڵ ئەکاتەوە ساغ
سروەی سازی دێ بەچەشنی فلوت
بۆ هاتنی بەهار ئەفیکێنێ سوت
دڵبۆ ژینەرەو نەشە هێنەرە
کۆسار چۆڕینەو چۆم خۆڕینەرە
چەنجیرەی لادێ لار و شەقۆشڕ
بە گۆڕمی شەماڵ دێنە زڕەزڕ
لە پەردەی فادائەکەن هاتوچۆ
گڕو زیک ئەبن وێنەی پیانۆ

شه مالی واده قامکان ئه گوری

ئاهه نگ سار ئه کات هه ر یه ك له کوری

له نیو بیشکه‌دا کور په‌ی خه‌زره‌ویو

ژیر ئه کاته وه وه‌ك ماستی مه یو

بای واده‌ی شه مال موژده پی‌ده ره

به‌هار غه ملینه و خه فه ت لا به ره

چه ژنه بڕ سوران چون سه و داییه

هاور بی‌شه ماله و خوی ته نیاییه

---

(١) شه مالی‌واده = بایه که‌که به فر ئه تاوینیته‌وه .

(٢) ره‌شه ممو = ئاخرمانگی زمستان

## « کاروانی که زیه کال »

که کا کولی که‌زیه کالو که مه‌ر که سکان کرانه و (١)

گه لاو گولی گه لا ریزی گولستانم گه‌شانه و

قه تاری قافلەی قەلبم كه قوم بوبوقه زای(٢) قوم

سروەی(٣) سوییانی(٤) سورانی وەك سورانی سورانەو

---

(١) كه سك = سەوز . (٢) قەزا = شارستان . (٣) سروە ــ نەسیم
(٤) سوییان = حەسرەتان = حەسرەت .

✲ ✡ ✡ ✡ ✲

## « ئاموژگاری پرشنگ(١) »

روله پرشنگ ئەی كیژوله ورد وژیر و لاوه كەم
چوزه خەلفی شلكو ساوای ژینه پر گیژاوه كەم
ئاموژ گاریم گوبدیره هیزی هەستی چاوه كەم
تا بلین پرشنگ بزانه و شایستەی باوا نیه

روله پرشنگ هەر بخوینەزور به ریزه خویندەوار
پلله پلله را یبویره مه كتەبی دیهاتو شار
تا ئه بیته دو كتو ریكی ریكو پیكو هوشیار
تا بلین پرشنگ به زەینه و نابیغەی ده و رانیه

روله پرشنگ زور وریرابه تو به گوتره شومه که
قه‌ت ته ماعی شوغلی زاواوده وله‌تی خه‌سومه که
شه‌رت‌ریکه‌وتی‌روحوفیکره ئه‌مه یبوسیودومه که
تا بلین پرشنگ قه واره‌ی هه‌یکه‌لی چازاییه

روله‌پرشنگ‌هه‌لمه واسه حاجیله وبه رموری زل
قه‌ت زه نگیا نه دامه دوره‌ومه‌یکه‌ده ستومه‌یخه‌مل
خوت مه‌رازینه‌وبه بو نه‌ی دیه‌شوردوخه‌نه و کل
تا بلین پرشنگی موکری خوی ئیلاهه‌ی جوانیه

روله پرشنگ به‌ره ممالو جادوگه‌ر بروا مه که
قه‌ت سه‌ر که وتو به ختیاریت له‌ساحیر داوامه که
نه‌ك بلیی یاسایه کونه ـ کونیش بی‌تو وامه که
تا بلین پرشنگ‌رونا که و بیروراي یه زدانیه

روله پرشنگ باسی ئالوشه وه و دیوه‌زمه مه که
خووخده‌ی‌ده‌وره‌ی نه‌زانین‌تو قه‌ت‌ئه‌م نه‌رمه مه که

گشت پرو پوچی به تالن سه‌یری ئه‌م به‌زمه‌مه که
تا بلین پرشنگ به دیده‌ی مه زه‌هری ئینسانیه
روله پرشنگ تائه توانی خزمه‌تی کومه‌ل بلکه
چاکه خوازی زه‌حمه‌تکیش به و ناحه‌زی ته‌مه‌ل بلکه
ئافه رینی هی یه که لکوده‌مکوتی ئه نگه‌ل بکه
تا بلین پرشنگ قوتابی فه لسه‌فه‌ی سورانیه

---

(١) پرشنگ کچی سورانه .

## « قه‌له‌م »

قه له‌م ژیره هاچه‌ری فامو بیره
مه غزبازه ئه‌ویش گوپالو شیره
په‌یکی زانا و هینه‌ری زانیا ریه
دوخی عه‌قله (١) و دژی چه و تیولاریه

داروغەی چیرو کو ویژه و انیه ـ

(۲)

نوسه ری هەلبەستی کاکی خانیه

سانیعی ئاهه نگو نه زموبەسته یه

زیزی نوتی دەوای جەستەی خەستەیە

تیری وینه و که وانی هونه رمەنده

میری نەخشوهەیکه لوبەر جەوەنده

دەربری ناڵەی بە سوزی جەرگمە

جی نشینو شوینه واری مەرگمە

رابەری نامەی بەتیپی دلبەره

هینەری سروەی ئه و ینی‌ها وسەره

هەستی سوران له بەروه رونو گەشه

قامکی دەستی بە دایم پینجوشه شه .

---

(۱) دژ = دوژمن . (۲) ئەم نیودیره واته : قەلەم وابه هیزه که مه موزینی خانی بەم نوسراوه .

# « سیزده بەدەر »

رابورد دەر وژەی (١) شوقاق بە تەپلە وە بەهارە
ر وژی سیزدە بە دەرە و کاتی گە شتو گوز ارە
خدەی کوردانی گور دە لە میۆە و یا دگارە
سوروشت پەر داخوشە نگە ئاهە نگی کرد گارە
وەك رەنگی نە خشی ناهید (٢) چیمەن سی بەنگی کریان
سوسنە داوات ئەگیرن بە نە زمی بە زمی ز ریان
بە قامی مەل خروشا شانوی دە شتی مو کریان
ئا ونگ‌لەسەر پە ری گول وەك عارەقی نیگارە
کیژانی تەر زوتە ر لان کە و تونە کیو و قو پی
بە وە زنی تە پلو بلویر ئەکیشن رە قسوچوپی
وەك میگەلی غەز الن لە قە دکیو و تروپی
ئە لیی ئاسکی بە لە سەن جیبیان (٢) چرو نسارە

رژانه باغومه ز را تیپی گه نجو شوره لاو
گور جوگو لوبه‌رامال، وه‌ك شمقاری فیره‌راو
خه‌ریكی كه یفو سه‌یرن له‌لاپالوقه را غ'او
سوران خوی سیزده به‌ده‌ر به سال چه‌ندین هه‌زاره

---

(١) ده روژه‌ی شوقاق = ده روژه‌ی هه وه لی به‌هار .
(٢) ناهید = وینه گه‌ری مه زنی‌ها و چه‌رخی كورد :
فه‌یزوللای ناهید . (٣) به له سه = ئ'واره .

## « وینه‌ی كه زیه خاو »

په‌ری كه زیه‌خاو ، په‌ری كه‌زیه‌خاو
وینه‌ت گه یشتو نامه بانی چاو
من وه‌ك په پوله‌ی په‌روبال سوتاو
وینه‌ت هاوشه وقی شه‌می گرته واو

ئه‌ی مژم تیشكی به دلوبه ناو

دیمەنی وینەت زور سەحەسوکە
(٢) مەرالوتە رزە ئەلیی نوبو کە
مە مکت پیفوکی قنچك پچوکە
خال لیی باریوە وەك بەفرەلوکە
گوپکەی سەرتەرزی خونچەی میکوکە

چاوت نەرگسیومە ستو خومارن
بروت نیوجە غزی هیلی پەرگارن
بسکت لاو لاوی بالای چنارن
کولمت هەناری ساوە و خونسارن
بەلگەی خەلقەتی پەروەردگان

پەریزادیکی ئیلهام هینەری
کیژیکی شەنگوسەر سورینەری
هومید پیدە روهەست بزوینەری
تەرلانو گورجو هەناو پیکەری
فیتنەی سوارنیو دلشیوینەری

## « سوزی کەمان » (١)

کە مانە کومەی کوری کەللەیی
بە سوزەی تووەمە بە ستم گەیی

سەرو کی تیپی خاست ئە ناسم
لیم نە بان مە بە من بوتو خاسم

تەلی میت ئە لیی ئاوی ژیانە
وینەی شو رەمەی بوخەم دە رمانە

لات لاپە لایەی دلشکاوانە
حە نجە رە ولورە هەرلەخوی جوانە

ریت ریخەرمانەبو جەرگەی خوشی
بە شەر هان ئە دابوخە مفروشی

سولت سە نگینە زور عیز قـانیە
جوری بلویری دە ستی شوانیە

هە لو یستە کانت زوخ ئە و یستینن (٢)
هە روەك قە نارەی سە رچل ئە خوینن

هەستی سروە کەت دل پشکوینە
شنەی شە پولت مەینەت وە رینە

نە شەی کومە ری دل زیندوانی
رازینە رە وەی بەستە و گورانی

دامە زرینەری نو تومە قامی
سەرچاوەی پەردەو نیوپەردە و گامی

شورینە رە وەی میشکی هیلاك بوی
حەسینە رە وەی ریبواری ماندوی

بە کول هینەری هیوای ژیانی
زیند و کەرە وەی هومید وجوانی

قورەی خە یالی سورانی بی تین
توهە لتگیر اسەر تریی شیرین

---

(١) کە مان ویلن . (٢) هە لویست = Posision

# « به‌هاری کوردستان »

چ جوانه خاکی کوردستان سه‌رنجی نه‌وبه‌هارانی
نیگارستانی تاهیدن لدوه (١) رگه و لیره و ارانی
که‌لوئاسوی‌وه کومه‌خمه‌ر که‌حه‌وره‌نگ بیتو سی به‌نگ بی
ئه کالیته‌و له پشتوینه‌ی روکاری میرغوزارانی
نه‌ها و شانی ئه پالاشیان (٢) نه ئیو ریستونه (٣) هی (٤) ئالین
جه‌له‌ی کیوانی مل به رزو قه تاره‌ی کوهسارانی
له قه ندیلی (٥) مامه‌کویان سوروشت بارن ئه‌کادایم
هه وینی به فره بارخانه‌ی کایله‌ی ده‌م نسارانی
ئه‌ر اراتی وه‌ك زوحه‌لله به‌لام و ینوسی کیوانه
له کاتیکدا اله مل ئه‌گری ته موهه لمی ئیوارانی
ئاژه لداران به تاقم دین به‌خیله وژور به‌ره و کویستان
دورو شمی ئاشتیو خوشین (٦) هه سوکه لتی‌هه وارانی
موچه ومه‌زرای‌خر وشاوه به هوهوی‌ده‌نگی وه‌رزیران
به بلویر وبا لوره وبه‌گورانی جوتیارانی

لەدەورەی بانە مەر بیری وەکو تاوس ئەپیکێن پول
شەتەکیەندن بەز هەلبینەی کە مەریەندی نیگارانی
زنەوکانیا و و چورچورەی ئەغەملینن مەنیو بیرا
بەچەپکی گول ئەنەخشینن قەراغی دەم روبارانی
جوت ئەگرن پولی دلداران بەتەنازی بودلبازی
غونەی هەستی دلدارین کورانو گو لعوزارانی
قوتابخانەی مەمو لاسو سیامەندو برایمو کە
سەر چاوەی عەشقو هەلبەستن کیژو لەی چاوخومارانی
عیبادەتگای کە مالاتە بەهاری خاکی کوردستان
لە باسی داخولوگیژن سورانانوهە ژارانی

---

(١) وینەگەری مەزنی کورد فەیزوللای ناهید = (٢) ئاپالاشیان
کیویکە لەئامریکای باکوری
(٣) ئیو ریست = کیویکە لە هیندوستان . (٤) ئالپ =
کیویکە لە سویس .(٥) کیویکە لە کوردستان . (٦) هەسوکەلت
معاشەرەت .

# « پەپولە وشەم »

پەپولەی هەزار گەیشتە خەلکی
تێکەلی نەشە و بەزموهە لپەرکی

سەرچو پیان گرتبولاوی زرنگوزیت
گاونیش لەدەست کوری کاکول قیت

کیژانیش بالا چوزە نە مامان
هەلیان ئەپەراند جوتە شە مامان

دە هو لو زورنامە زەی بە ندانبو
گورانیش وەك مەی نەشەی لاوانبو

سەرە ژنا نوپیاوانی پیر پیر
لەکن هە لپە رکیدلیان کردبوژیر

موسیقای سینحمەو بە روکو بەرەور
میشکی رون ئە کردئە یکردبە بلور

دوی کوردستانی شیری مە رانە
بەلام هی شایی ئاوی ژیانە

لەنیو شایشدا مومی (١) ئەدرەوشا
هەستی پەپولەی بوخوی راکیشا

زاوای نەونەمام کورەی میردمندال
لەگەل پەپولەکردی بەجەنجال

ئەی ویست پەپولە بچی بوشایی
دلی نەشکینی کاتی زاوایی
پەپولە ماتەی پەروبال بەخال
نەیتوانی روی خوی لەکور بکاتال

خزایە بەزموکوری بەزمەوە
بەریکو پیکیو گەشەونەزمەوە
کەفەقیانەکەی (٢) ئەدرەوشایەوە
مومی دامردو ئەگەشایەوە
موم لەسەر چوپیو ئەم لەگاوانی
ئەسرینیان ئەرشت کەس نەی ئەزانی

بە زە بری ئەوین نزیك بونە وە
چونـە لاشانـی یە کترینە وە
ئاویتەی یەك بون چ گیان ج لەشیان
ئە بو هە روابن هەروا بوبە شیان
ئیسك و پلوسکیان بوبە بولەمر
لە توزی ئە وان سوران بوبە کور

(١) موم = شە مع . فەقیانە = سورانی .

## «( سکالا لەفەلەك )»

ئەی فە لە کی کە ج نەزەری سپلەی نا بار
چە پنە زەری چەپخونی بی پەردەی ئیش لار
لە گە لم بوچی بە قینیت ملهوری غەددار
ئە لیم خوم گیژ کەم و کە ودەن وە کوسادار
مە گەر ئە و کاتە لە من ببیتە مە دە دکار

تیاما و مو نازانم کە چۆن خەلق کراویت

بە بەری ئە بلە میز انیتو بر اویت

هاواڵی بە گەوج دۆستی بەلەوج ناحەزی پیاویت

لە مە قاریتو وە کوە گولی قور اویت قراویت

بۆ سورانی کزوژ اکاوبە لە نجیتو سراویت

---

(١) سکاڵا == شکات .

## « چورا خشتەگی »

دازایی دنیاوەك چڵكی دەستە

ئەم چڵكەش زیاتر هی دەستی پەستە

سۆزان چە پەلی کە لکێکی نیە

ئە و کە سە کە سە کە بە مەی مەستە -

# شانۆی ساڵی تازە

ئەوادیسان بەهارهات و کەژوکێو پارچە ملاوە
لەشەوقی دیمەنی جوانی قەڵەمڕەوی لێ ورماوە
شنەی باسەرئەلاوێنێ بەعەتری گوڵدڵی بولبول (١)
گۆرانی و چریو بەزمەچ لەملاوەچ لەولاوە
قەنارەو قومری و سیرو لەسەر دارولەبەر زەردن (٢)
سەروکی تیپی موسیقای تەیوشیو و کەلوهەزدن
خەریکی وەسفی مەولودە و قلیجقایەو کەماجارن
بوێژی کانیو باغو ملەو چۆمو پلەو بەردن
ڕوکاری چیمەنو قوپی بەهارستانی شیرینن
هەوارگەی کوزەلەو پنگەو مەنیو بەیبونو نەسرینن
شەتاووجوگەلەو چۆمی تەنیشتی باغی ئاواتم
بەکەوسەرپەنگو پاراوو پڕوشەنگولورەنگینن
گەزیزەی پیرموحەممەدهەروەکوپیروزەزەخشانن

گیلاخەو کەنگرو مەزرەدیاری شاهی مەردانن
چروشاخی قەرەتەکیەکەهوی ئیلهامی سورانە
پەریزوبەندەنی تەرزی ئەلیی دیبای ئەلوانن

(١) باسەر= بایەکە لە بەهار دادیت . (٢) زەرد= شاخوچر (*) کیویکە لە موکریان

# « شیوەنی سوروشت »

کاتی قاوە لتون (١) بەگەلاریزان
تەنورەی شەمال ئەمالن کولان
پاسارجمیانە و دەر گاژەنانە
لەحەو شەو لە بان تەقلەدەوانە
نیوەرو داهات ئاسوئەبی لیل
شەمالە شیتە دیتەگەشتوگیل

لـه رۆژ اواوه گیژه لو كه‌ى لول (٢)
جه‌له ئه به ستن دینه گه ردو لول

مل له مل ئه نین گژه بای به سام
له کیو و له‌ری ـ له‌چولگه وشه‌قام

ئه‌م گژه بایه هه ناسه و ئاخه
شینی سوروشته ـ به ئاخو داخه

تـا سه‌ی هاو ینو گه‌شه‌ی به هاره
جـه حیلی رابورد وابی قه راره

سوروشتـه پیره قو ر پیو انیه
دلی که پیر بوعه شقی جو انیه

گه‌ییه دارستان ده نگیان پی ئه دا
دارو گیاش له باس شاره زائه کا

ئه وانیش دینه عه‌لقه‌ی شینه وه
به هاژه‌ی ده رون به گرینه وه

فرمێسك زەردویی بەچین دێنەخوار
ڕومەتیەك ئەڕنن وەك مەردەمودار

لاشەکە نگرو بنچکۆ دڕکوداڵ
ئەچنە قوڕەوە بەهاوڕێی شەماڵ
پاکیان ڕائەکەن زەناوڕ و ڕ ویە
خۆشی هە تاسەر بۆکەس درۆیە

لـە ئێوارە دادڵیان ئەبێ ژێـر
ڕەش پۆشیان ئەکاهەوری ئیقلیم گیر
لە سوێر و چۆنی چەرخی جەحێلی
فەلەك ئەیڕێژێ ئاوی تەو یلی

پرژاوەی لاجانگ دێنەخوار دەمدەم
بێ هەست ئەبارێ تەپتەپۆنەمنەم
دڵی پیر ئەبێ کوڵی گریان دێ
جا پەڵە ئەداو کو پاڵ باران دێ

ئیدی شه مالیش سالخوشمان ئەلیت
هه تا بای وادەله قابوغ ئه خزیت (٣)

له پاشان زریان پیك دینی خه زان
لەجیگای بازان کویران ئاوازان

هەتاره شه ممو گریان ناوه ستیت
بارانی فرمسیك وەك بەفر ئەی بەستیت

سور انیش ئه سرین پرله چاویه
دلپـری بزه و قاقای لاویـه

---

(١) گه لا زیزان = نیو ەراست مانگی پاییز . (٢) روژاوا مه غریب . (٣) بای واده ـ بایه که له ئاخری زستاندا به فر ئه تاو ینیتەو .

## « بەزمی مەیخانه »

به هاوریی چاونه خوشان گەینه کوری مەینوشان
چوینه رزی مه جلیی مه ستا نو چاو خوماران

شانۆی بەزمی مەیخانە وەك چیمەنی گوڵخانە
کە وتە سەما بە سۆزەی کەمانو عودو تاران

چڕگەر (١) بە هەستی گەرمی ئەیکوت بەدەنگی نەرمی
ئەیخستە کەیفونەشئە کزانو دڵپەژارن

مەیگێڕ (٢) بە لارولەنجە بە نازی دەستو پەنجە
بیساتی مەی ئەگێڕاڵە بەینی دۆستو یاران

مەزەی شەرابی تاڵی ماچی دولێوی ئاڵی
پەڵکەی شێواوی کاڵی بوبە داوی هەژاران

منو دڵبەر بە مەستی بوینە جەزبی ئەلەسی
خوماری عەشقومەی بوین بەگوێرەی بێقەراران

سۆران نەچێری داوە گیرۆدەو دڵنەماوە
لە سای تیری نیگاهی گەیی بەدەردەداران

---

(١) چڕگەر = گۆرانی بێژ . مەیگێڕ = ساقی .

# خەزان ( لەباغ )

چون خەزانە باغی ئاوات ئیسە کاری زاریە
پولی دارو بنچکو گول پاکی دەردی کاریە

بای هەناسەی ئاخی زریان‌هیر شوراماڵ ئەبا
سەیلی ئەشکی کاڵی زەردی نەونەمامی‌جاریە

بابە هاژەی بیو چانی شیوە نـونا لینیە
قشقەرەی بی خانو لانی یەك بەخوی هاواریە

بینی عەتری لالە کانی مەحوە ناگاتە موشام
بونی توندی سیرە باغی جی‌گر و جی داریە

دەنگی قومیرسە قروسیروی لی‌براوە خەلوەتە
کوندە بوی‌ویرانو چولی ویژەری شەوگاریە

چیمەلانی جوانی تەرزی و اکروزوبی‌دەقە
کە دوروشمی بی وە فاییوسە غلە تیو بیزاریە (٢)

شەختە خونکاری شەقامو داروغەی‌چوارریەتی

لالقوته رزوتروپـی روته بەم بیماریە

من بەهاری بی خە زانم قەت نەدیوە تائە ژیم

غەیری باغی شیعری سوران پایزیش گولنا ریە

---

(١) باغی ئاوات = باغە کەی سوران . (٢) دوروشم = عەلامەت = ئارم .

☆ ☆ ☆ ☆ ☆

سوران ئەم پارچەهە لبەستەی خوارەوەی لە بارەی لە دنیادەرچونی باوکی دانوسیوە :

## « هەلبەستی فرمیسکاوی »

ئەم سال چوار سالە بوتخانە چولە
لەتاسەت ئەی بوت جەرگم هولولە
ئەتـو زو یشتیو لـەشت بو ئارام (١)
بەلام من کز و یلوتە وە للام
قەت خەیال نەکەی کەمەیلت بنیم
هەرغولامەکەی عەلقەی تولە گویم

کاتی که زریان غیره ت ئه نو ینیت
هه ناسه‌ی پا کی گلکوی تودینیت
ره گی ئه ندامم دائه له رز ینیت
ئا وا تو بیرم وه خه به ردینیت

هه ستو خه یالم دینیته وخه به ر
ئه لی سورانی سایه‌ی صادله‌سه‌ر (٢)
ئه سپارم ده‌م هه یه له لای پیره وه
ئه‌م دوهه لبه سته‌ن بی خه بیره وه:

قه‌ت‌خوت گوم نه که‌ی‌ریگای‌تودیاره
هه‌ـه ر چه نده لیژ وچر و نسا ره
به سنیه پا کـه چش چو لو هو له
ره پیلگه‌ی پیاوان هه روا یه‌ر و له

ئه لیم ئه‌ی زریان بای خه‌م داهینه‌ر
خونکاری زستان کر یـوه چینه ر (٣)

له ده ورت گه ریم په یکی حالزانم
به هوی تو وه یه دریژه ی ژیانم
چا که جار به جار هه والی دینیت
له نیوه مه رگی هه لم ئـه ستینیت

ده خیلم زریان ببه به شه مال
بهره و پاش برو بمنیره سهر بال
بمبه سهر گلکوی باوکی بی وینهم
چون من سه و دایی ئه و دلشیوینهم

ده رویشی کوری خانه قا کهیم
پا بهندی که مهند باره گا کهیم
راز و نیازم زور ههیه لـهوی
ههتا پیی نه لیم دلم نا سرهوی

بزانم چیه بو دلره نجه ئه و
بوچی ته نانهت نایبینم به خه و

بزانم بوچی کاتی کوچکـردن
نه یسپراردم به خواسه ردەمی مردن

دستمه نادەستی ته لیسمی خەیال
ئه مکوت عازیزم بوم به کوی زوخال

بـوچی هیچ نالیی ئاواتی ژینم
چاوت هه لینه به لگەی ئه و ینم (۴)

دواکاته که من له سەرینی توم
نازانی غه رقی زاریو شینی توم

سەر وکی مالم ساقی خه یالم
مەیگیری (۵) زانای پیالەی که مالم

زریان ! هەرچیم کردوه لامی نه دام
جوابی به یا نوکه لامی نه دام

له وسه عاته وه من بالم شکا
شوشەی کورینیو جـه مالم شکا

چو کیشم نەیما یاریدە و هیزی
قوە و هەیبە تو توانا یو پیزی
بویە پیت ئە لیم بمنیرە سەر بال
لای ئەو ئەی ریژم فرمیسکی چوارسال

---

ئە سرینی لیشاو وەك تاوە باران
هەنیسکی پساو وەك گژەی داران
شیوە نی بکەم فەلەك مەحزون کەم
تەمی هەناسەم بەرە و گەر دون کەم
لەسویراوی چاو خوینا و بر ژینم
بلیسەی دلم بە و دامرینم
بلیم حەسەنی دەست پەر وەردەی تو
سورانی تو یە لە هەرعەرزی بو

---

(١) لەش = بەدەن (٢) صاد = پیتی (ص) کە پیتی هەوەلی شورەتی باوکی بوە کە ئەبیتە (صلاح) (٣) خونکار = فەرمانرەوا (٤) بە لگە = دەلیل . (٥) مەیگیر = ساقی .

ئەم پارچە هەلبەستەی لەبارەی (سید طه شمزنیان)دانوسیوە :

# « تاهای شەمزین »

لە رو ئیا داوبە ئەغیاری کە ماتو چاوبەئەسر ینم
گیرودەی عەشقی تاها مو خەریکی ماتەمو شینم
عەلقەی نەهری لەگویمایەووە کو روحم ئەیپاریزم
بە شەمزینەو شەتەکبەندە نەواری سەردەمی ژینم
بە حەرفی (طی) وە(هی) قەستەم بەتاهاوەدلم مەستە
لە شەمزینەوسەری هەلداکزەی ئیلهامی ریی دینم
لەدەیجوری ژیا نمداوەکو گەوهەر گزنگ ئەرژی (١)
لە عاسمانی شەوەزنگما تەهایەمانگو پەروینم
لە سویی عەشقی بەروژ وشەولەدلما مەحشەرهەستاوە
خەلایق پاکی عاجز بون لەدەستی ئاهو نالینم
قوتابی مەکتەبیکم من کەپرشنگی لەپو لو بو (٢)
لەکن تیشکی موحەببەت بوم کەئیستاداخوپرتینم

له گیژ اوه‌ی ژیانمدا به تا ها وه ئه به‌ستم پشت
سورانی ده ستی تا ها موغولامی پیری شه مزینم

---

( ١ ) گزنگ = ء ه شیعه ( ٢ ) پولو = سکل .

## « په یامی وه‌نه وشه »

ئه ی شنه ی شه مال خه‌م وه رینه که م
ته نگو چه له مه‌ی دل ده رهینه که م
لای دله و دیبو دل ئه بو ژ ینیت
گر و بلیسه‌ ی دل ئه‌کو ژ ینیت
چاوه که م شه مال وه ره پیشه وه
بچو ده رونی دلی ریشه وه
بلی به دلم په یا می گو لم
گولی ته وه للای نا و لقو چلم

بلـێ ئه ی دڵه خه زان کێشه کـه
دڵی چه‌و ساو ه ی هیجران کێشه که

من شه ما ڵمو شاره زای (۱) هه ر هه رد
دوی شه و ر ێبوار بوم له شاخو له به رد

ر ێم که و ته هود ه‌ی کۆر ده ماله کان
خاوه نـێ سه و زه و سه رزه خالـه کان

لـه ده ڵاقـه را چـو مـه دیـواخان
لـه پاش خێر ها تـو شه و بـاشی میوان

سه رنجی کێشا م گـۆ لیکێ ژ اکا و
چوزه وه نه و شه‌ی گه ڵاو گۆڵ شێو او

کـوتم وه نـه وشه ی شـۆ ر ی شیرینم
گێر ود ه‌ی داو ی غـه مت ئـه بینم

کێژه خـو نچیله ئـه من شه ما ڵـم
نا سیاوو شناس هه ر کـور ده ما ڵـم

شه ماله شیته‌م نا و یکم هه یه
گزه وزه به ندیو تا ویکم هه یه
خـه فـه تت بلی دلـی دلپسا و
دلشادت ئه که م شه رته شه رتی پیلاو
گولی نا سکم ده‌ست په‌روه رده‌ی خوم
ئه سپار ده‌ت بلی ر یبوارم ئه ر و م
په یامت ئه به م بی‌سو چو په نا
ئه ید ه‌م به‌دلی بو تو مـو بته لا
کوتی ئه‌ی شه مال راسته‌وخو بر و
وچان ده ر نه که‌ی له به نده نو کو
مه به ستت بولای شو ره‌لاو ی بیت
بو شا نشینی به له کچاوی بیت
به لام ئه‌ی شه مال شیتی په تیاره
ئه سپایی بدوی دلی ناز داره

کاکۆڵی لولی هەڵنە شێوێنی
ئەگەر خەوتبو ڕاینە چڵەکێنی
سلاوی لێ بکەی بەتوندنەی دوێنی
پالای نەمانی دانە لەرزێنی

چونکە ڕیشەکەی ڕیشەی دڵمە
(۲)
پەخشانی جەرگو سیو سپلمە
تولە نەمامە و بلەرزێتەوە
بەندی هەناوم ئەپسێتەوە

بڵێ وەنەوشەی خۆشەویستی تو
بەتو وە بەندە لەهەرکوێیە بو
بەرهەڵستی نین چوڵگە و دیواران
تێکەڵ بیرتەشە و سوئیواران
بو توژاکاوە هەڵنە گڵو فراوە
لە دوری تویەگە لای وەراوە

(٣)
تینـوی زاراوی زاری یاریە
دە ماوی نە دەی دەردی کاریە

وە رەسەز یالم باز و تربت بەم
بە رە و وە نەوشە شا بالم لیدەم

تیکەلی گول بە با بیگول نە بی
سوران توش وە رە ڕابیدل نەبی

---

(١) شارە زا = بە لەد . (٢) پەخشانی = بلاوی .
(٣) زارو = ئاوی دەم

# « ئەسرینی شادی »

دیسانە وچاوی‌سەحجاری تەلی ئیلهام ئە بزوینیت
بلیسەی‌ئاگری‌عەشقم‌خورەی ئەشکم‌بەکول‌دینییت

بەلام ئەمجارە ئەسرینم‌لەگەل قاقا بە تیکر دین
چون ئەمرو کە پەچەی‌لاداوبەتە نازی‌دەمی‌دینیت

تکەی عارەق‌لەسەر گونای‌رە واقی تەلعەتی‌خوسنە
بەجاری نرخی یاقوتو دور و دور دانەئەشکینیت

خودا یاچەندە شیرینە مەزەی‌لیوی بلالوکی
لەلایەکەوسەرئەفروشی لەلایەکدل ئەشەمزینیت

ئیلاهی ئەم دەسە ملانەمەبارەک بی لەکولمی گول
گژەی‌بادی‌خەزان‌هەرگیز بەهاری روی‌نەژاکینیت

چون ئەمروجەژنی سورانە بەمەستی جوری‌پەروانە
لەدەوری شەمعی مەیخانە پەروبالی ئەسوتینیت

## « گەوی بوران پیچ »

رۆژیکی زستان کانی چە شتانگاو (١)
مارەکەی ئەکرد کریوەو ززیان
شوشە پەنجیران بەشوشە سەهول
بربز ویستابون وەك گولی دەبان

زریانە دزەگە ردو لولی بو
تویژی بە فرانی ئە هیناجە ولان
خەفەنگی لە ناوپەنجیرەی مامڵا
بەگورەی زریان کەوتەسەرلەقان

کانی کراوە تاوی کریوە
کە ویکی هینا بوناو دیواخان
هە ژاروبیکەس هیمن وهە ردی
بە قاسپەی گەرو بەربو بەگریان

کوتی که ویکی تیژ بالو گورج بوم

شا بالم ئه دا له نوکی شاخان

به لام ئیستا که سوروشتی ئیش لار

شری کردو وم به سوله‌ی (٢) به یان

په نام هیناوه به‌م گه وره ماله

تاروژو ژینم نه‌چن به تالان

باوك عیسانی زانا و به‌ریز بو

هه‌ر کات په نابوبو لیقه و ماوان

کوره‌ش لاویکی ژیرور وناك بو

رونایی سه‌ند بوله گه وره پیاوان

کوتیان که وه که‌تو میوانی مه‌ی

به ریزت ئه گرین به دلو به گیان

فاوی به ناوه ئه‌م مـو کر یا نه

بوخولکوخزمه‌ت ـ دیوانو میوان

ئیمه حه‌شارگای ده‌ربه‌ده‌ران بوین
بو روم بوعه‌ره‌ب بوترك بویونان
جیگات سه‌ر چاوه که‌وی مل به‌خال
یه‌مینه لیره سی مانگه‌ی زستان
که‌وهاته‌و سه‌رخوو ماوه‌له‌م ماله
به ژیانی خوش به جیره‌ی ته‌رخان
کسپه‌ی سه‌هولبه‌ست بوی بو به‌هاوین
هیچ قوتبی نه بونه تا لیشك نه‌دان
خوش پوشو خوش نوش خوشدرو خوش پوش
کاتی به سه‌ر برد به له‌ونیکی جوان
به‌هار ئاخری ده روژه‌ی شوقاق
که‌وته په‌ر بازیو هاته فیتودان
ئیجازه‌ی وه‌رگرت بومه‌ره‌خه‌سبون
بوناو که‌سوکار بوسه‌ر نیه‌ولان

باوکی بزانو کوری پرخەیال

کەویان بەری کرد بوچیا و کیوان

بو بیرەواری کرد یانەملی

(٣) دوزو شمی بەنرخ بوچەرخوزەمان

کەوی قاسپەخوش بەزیرەی بەرزی

خری کرد لەخوی گشت پەلەوەران

کوتی من ئەمسال پەناهینەر بوم

بوران پیچ کەوتم لە ناوبەگزادان

هوزیکی ژیرن رەگەزیان پاکە

سەر تاکن لە نیوتەواوی جیهان

قوشەکەی ملم دیارەکە بوخوی

نەخشاوە بە هوی ناوی موکریان

سورانی ئەویش کە خاوەن بیرە

زانا بوبە هوی پیاوانی بزان

---

(١) چەشتانگا و = قاوەلتون (٢) سولە = سەرما .
(٣) دوروشم = ئارم = عەلامت .

## « چورا خشتەگی »

ئەم دە قیقەیە کە تیپد ئەدە ژیت
ئیستە تیپدا یو- ئەلعان دەرئەچیت
سوران وەرگرە کەلك لەم کاتە
چون مەعلوم نیە دوای ئە مەنەمریت

## « فیتنە »

لەکن من چاوی فیتنەو نەرگسی خوممار یەکن
ئە بروی چەنگی سەنەموعە لقەی پەرگاریەکن
غەبغە بەی شلکو پتەو لەگەل قەددی سەروئەشو بهین
قژی قرژی سە نە مومە زرەی کوساریەکن
بەر کولی ئاوی ژیان مژینی زار اویە تی
بە مەزەی ماچی دەمی سەر مەستو هوشیاریەکن
مەمکی ساواو شلکو کرچنو کالن وەکو کوخ
سەر نجی باغی سنگیودیمەنی گولزاریەکن

لەسویی کولمی گەشی گولژینمەوە هاماوە پەشیو
لە دلمار وژی زونوزولمەتی شەو گاریەکن
ئەگەر (۱) بیتو بە شەو اکاتی لە ئامیزی گرم
تە نیشتی شەوقی ئەو وەهە تاوی دەو واریەکن
بەگری عەشقی نیگارهەستی سوران هاتەکولان
بویە هەلبەستی منومەولەویو (۲) هەژاریەکن

---

(۱) ئامیز = باوەش . (۳)هەژار = هونەری پایە بەرزی کوردمامووستاهەژار .

## « مانگی گولان » (۱)

لە مەز رادیم بە ئیوارەی بون خوشی بەهاران
جوا ناوی فەلەك لەگەر دونە ئە باران
گولاوی گولاو وەکو دەنکی هەناران
تکابون لەگو لالە یەژومارە بە هەزاران
نەشەهینودلگەشینو گیان حەسین بونشنەی داران

بارشتی به یار یزەو شولاوە و گور بو

شیر پالەکی رە نگینی زەوی وینەی دور بو

سیروە دەنگ خوشه به فیتوسەری سور بو

کولکه زیرینه چه ماوەی سەری چر بو

هه تاویش ماق ما بو بەرەنگی زەرد لەنساران

خور که چار شیوی وەکو کردو وەلاخست

بوعه تری ریحانه و گه زیرانی بەحه واخست

ما فورەی ئاونگی دلوپینی که راخست

چله هیرو و گولەزەردو (٢) گوزراوانی بەسه ماخست

بەرجەوەندی دلپشکوینه ـ خەم وەرینەدی ئیوژان

(٣) ئه حمه دراوکەرکه لەسەر پەلك ئه خوینی

گور جوگوله ئەو چنگو لەچ فلوتیك ئه ژینی

له به سته وله گورانیو له مه قامان ئه هینی

داخی زستانی کوس کەوتو بەموسیقا ئەر ژینی

ئەلی سوران وەزە گەرمەبه گولان بەزمی هەژاران

(١) مانگی گوڵان = نیوەڕاستمانگی بەهار . (٢) گوزروان گوڵێکە . (٣) ئەحمەدراوکەر = پەلەوەرێکە

ئەم پارچەهەڵبەستە وەسیەتنامەیەکە ، کە سۆران نوسیویەتی:

## لەپاش دەرچونی ئاخرهەناسەم

هاوەڵان خزمان گوێ ڕابدێرن
بەم وەسیە تا ئەم زەین بسپێرن
لە پاش دەرچونی ئاخرهەناسەم
کاتی وێستانی ئەم دڵە ڕاسەم
خڕبن لەدەوری عەلقەی تەرمەکەم
لەکن قاپوری هەستە نەرمەکەم (١)
باوکی شارەزام پیری خانەقام
لەوێش بە ڕوئیا ڕاوەستێ لەلام
چونکە شێوەکەی نەخشی مەغزمە
هەستی هەتاوی دەوزەی جەغزمە (٢)

دایکی پە ژارەی کزی بی تینم
لە کانی دلیە وەھە لقولی شینم
برای خوشەویست جیگای شا نازیم
ھا وریی بە ریزی نزمیوھە ورازیم

وە کوئاگری بملا وینیـە و
بە شیعری کوردی بمرا زینیتە و
خوشکی دلرە قو ژیرو دلنە رمم
ئە سرین برژینن لای دازە تەزمم

(٣)
ئە میری وردم ئاواتی ژ ینم
بگریتە باوەش لاشەی بی تینم
دەم بنیتە ناو زاری تیکنر او
زاریو شە پوری بەرد بکابە ئاو

(٤) (٥)
پرشنگوفەر ھادگریانی ساز کەن
لەفرمیسکی وان قوزم بو خاس کەن

هـاوڵا نیشم کـە بەندی دڵمن
ئە وینی پە خشی جەر گو سپڵمن

لە کن لاشە کدم کۆبنە و. بە عام
شیوەن بگیرن ڕێك بە دە ستە وام

بە ڵام ڕە فیقان قەسەم بە عیسان
سویند بە ئە وینی خاکی مو کریان

کاتێ لە مز گەوت کفن ئە کەن لەشم
خۆتان ئە زانن لەژین بێ بەشم

بە نەرمو نیان بارە و بارم کەن
دیسان بە شیوەن منە تیارم کەن

لە پاش بە ستنی بەرگی سپێوسول
بێنە ژێر مە یتم لاوی گۆر جو گۆل

دیسان جە نازەم بەر نە ورو بە ماڵ
بۆ کن کە سو کار نێو خز مو منداڵ

بابو ئاخر جار هەستم دەر بڕم
بەڕا نیەر خزمی کزی دڵشرم

لە وەبەر وانن ئەگدامم سرە
دڵم ئەو کاتەش لە ئەوین پڕە

ئەمجار بە چەمەر بمبەن بوقەبران
بو پیرموحەممەدجیگای (٦) پشودان

لەکن ئیلهامی بیروخەیالم
لە لای مەیگێری پیالەی کەمالم

بمنینە ژێر گڵ سوکوئە سپایی
بمدە نە دەستی رەحمی خودایی

بەڵام کێلەکەم بەردی مەرمەربی
خوراگر هەتا کاتی سەرسەر بی

لە سەر ئەم کێلە ناوی نیشتمان
بەزل بینوسن بەشێوەی سوران

لەویش عومەر (٧) گیان غیرەت بنوێنێ
ئەم هەڵبەستانە بە دەنگ بخوێنێ

ئەمجار لە دوای من کەسوکارەکەم
کوڕی هاواڵی دڵپەژارەکەم

جێ بەجێی بکەن ئەم وەسیەتانە
هەتا دوا خولی چەرخی زەمانە

نووسراوەکانم کە مایەی ژینمن
چۆڕاوەی زامی دڵی برینمن

لە چاپی بدەن پەخشی کەن تەواو
تیا با ها و بەش بن تیپی کێژولاو

چاو دێری بکەن شیتاڵی نەکەن
بازیچەی دەستی منداڵی نەکەن

با تا دواخولی گەڕانی زەمان
شەختە نەیگەزێ گوڵخانەی سۆران

---

(١) هەست = حیس (٢) = جەغز = دایرە (٣) ئەمیر کوڕی سۆرانە . (٤) پرشنگ کچی سۆرانە . (٥) فەرهاد کوڕی سۆرانە. (٦) پیرموحەمەد = کێوێکە کە باوکی سۆران لەوێ نێژراوە
(٧) عومەر = ع . تیکانتەپە (ئەمیرکیا)

# «ئاهۆنا لەی دڵ»

بسکی ئاڵۆزە وەکوچەپکە گەزیزە دەقی نایە
هەر کاتێ کە پەخشە ولە تەنیشت هەنیەی تایە
کادینی دڵم چۆڵە بە ئێدم کاهڕ و بایە
بنە گوێی تە ختی خونکار و جێگای میرە دڵم شایە
ئە فلاکوجیها نۆلی پرسینم لەکن بایە

عەتری نە زەری دائە وەری لێم بە تە پونم
لاتیلی ئە لێی بە رقە ئە برژێنی دە رونم
بۆ چاوی گەشی دە ربە دەرو روتو زە بونم
چاوێکی لە من بێ یەکێکن بو تو نە بونم
عاشق دڵی شایە بۆ دیدەی تویە گە دایە

دەست بە ئەژنۆ و چاولە دە رگا موهەژارم
عەشقی دە مدانە وەی گوڵخونچەی زارم

بوژه رده خه‌نه‌ی زارته‌که شته‌نگمو زارم
به بزه‌ی لیوی چون شه که‌رت کاریه کارم

دلم مه سته چون دلبازی هه‌ر وه هایه

خولی ئیشاره و داماوی له نجه‌ی شه نگم
پیکراوموز امداری که وانی جو تو چه نگم
بر ژولیه تیری که ئه من بوردی خه ده نگم
وه کوفه‌ر هادم ئه زانم که به‌شی تاوی‌قو له‌نگم

دلی سوران که مه جنونه بو له یلایه

✡ ✡ ✡
✡ ✡
✡

## « جیگای عیبره‌ت »

روژی دیمه وه له نیو گلکو یه‌ك
(۱) قامکه وانه یه‌ك‌لای ره‌نجه رویه‌ك

تاوی پیکه نیم به عه‌لقه‌ی لاری
جاری ئه مله قاند نقیمی خواری

وه ختی کەئیسکم بارە وبارئەکرد
هەستی و یجدانم برینداری کرد
لە پر عەلقەکە لیم هاتە زمان
کوتی ئەی بەشەر سادەی بەسزمان
توش غەر رامە بە بەم دنیا دونەت
لە بەر چاوتە ئیستا نمونەت
من ئەنگوستیلەی گولعوزاری بوم
هاوسەرین خاوەن لەنجەولاری بوم
خشلو زیوەری نەو جوانیکم
عەلقەی دیاری دەزگیرانیکم
خاوەنی منیش عاشقی ژین بو
بەو ینەی سوران دیلی ئەوین بو
تا قانە کچ بونازەنینی بو
چاوگە لاویژی مەهجەبینی بو

جێگای عیبره ته وازی لی بینه
له خەوی مەرگی رامه چله کینه

بەم ئاسنیەی خوم من چاوم لییه
ئه وبی هەست نیه و جیهانی جوییه

نەك دوامالی توش چەرخی جه فاکار
بیکاته گالتەی سەر پەنجەی ئەغیار

که وابی سوران حەقیه وامه باح
بە ریزی ئەگری عالەمی ئه رواح

---

(١) قامکه وانه = ئه نگو ستیله .

(۱)

# « پەرتوك »

بە مندالی لەدەرگای قیبلەکەی خوم
کەلە هیچ کابەیەکدا نەیبونەوم

خدەبار بوم بەکتیبو بەخەیال
ئیلهامی دام بەزانیاریو بەکەمال

لەگور و گالی پترنەهبو زمان
هی خورا واوەی باکوروەی خومان

بەهوی کەشکولی بەنوکاغەزو خەت
دەرویشی واکە رولال بوبلیمەت

(۲)
فیری کردم بەپینو سوبەپەراو
حەوت زمانی سەر بەخودامەزراو

لەسەر روکاری کتیب قوم ئەژەنم
شورەمەی هەل ئەمژم پربەدەمم

من و پەرتو کوخە یال پیکە وئەژین

لەنیوفیردەوسی زانستمەی ئەچیژین

مەی چ مەی کایە بە کەوسەر ئەبە کا

کولەبی خەیال چەشنی سنەوبەرئەکا

سوران نەی دی لەجا ما گاوی تری

مەستوسەرخوشی مەی زانستە بری

---

(١) پەرتوك = کتیب . (٢) پە راو = دەفتر .

## « چوار خشتەکی »

عومری داهاتو چون ناد یارە

خەیال پلاو و گالتە و قومارە

سوران بیری خوت بە وخەریکەکە

چون ئەیحتیمالی یەك بە هەزارە

# « ئاوری نەورۆز »

حەوت شەو و رۆژی رەبەق (١)
هات شەماڵی کەللەشەق
دوایی هات بورجی لەق لەق
ۆابورد زستانی دڵرەق

شەماڵ گەڵی بە پۆزە
چونکە ئاوری نەورۆزە

شەماڵ زریانی کرد شەل
ئەتوێنی بەفری سەرکەل
شنگو گێلاخە و خەردەل
ئەمرو کێنە دەشت بەگەل

ئەکەن جەژنە پیرۆزە
چونکە ئاوری نەورۆزە

گه زیزه‌ی سالی تـا زه

بو نخوشه بی ئه ندازه

به هار گه ییه ده‌ر و ازه

کاتـی ر از و نیـا زه

مه‌ل ئه دوی تو زه تو زه

چونکه ئا وری نه و رو زه

(٢)

لـه شار ستـا نیـو بلباس

ئـه پـوشن سیپالـی خـاس

ده ق ئه ده ن فه‌ر شو پلاس

ده‌ر ئه کـه‌ن زستانی کاس

مـه یاره‌ك بـی له‌م هـوزه

چونکه ئاوری نه‌و رو زه

مندا لـی ور دی دلجـوان

ئه‌ر ژینه کوچه و کولان

پوش ئه کیشن بـوسەر بان
دای ئه نین به دلو به گیان
مند ال ده مـاغی قـو زه
چونکه ئا وری نه و رو زه
هیلکەی سور و ئا لو مور
سه و زو کەسکو زه رد و بور
ئه ینه خشینن جور به جور
ئه یگور نه وه نو ر به نور
دنیا بـویـه ئـا لـو زه
چونکه ئا وری نه و رو زه
خـور ئا و ابـولـه نسار
هاته ژو ره وه بـه هـار
دامـرد زستانـی بیعـار
دیسان جوت ئه گرن دلدار

